
سەردار فەتاح
خەرمانێک
لە
مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی

# خەرمانێــك لەمـەتەڵ

## فۆلكلۆری كوردی

كۆكردنەوەی

**سەردار فەتاح ئەمین**

**١٩٧٧**

سلێمانی

وەزارەتی ڕاگەیاندن

بەژمارە ٩٥ ی ڕۆژی ٩٧٧/٧/٢٣ ڕێگای لەچاپدانی داوە

سلێمانی — چاپخانەی ڕاپەڕین

خوێنەری بەڕێز : . !!

ئەم چەندمەتەڵە فۆلکلۆرەی لەم نامیلکەیەدا کۆبۆتەوە هیچ ئازایەتیو ماندوو بوونێکی منی تێدا نییە .! تەنها ئەوەندە نەبێت ، کۆم کردۆتەوەو خستومەتە بەردەست .

ئیتر تەنها داواکاریم لەئێوەی ئازیز ئەوەیە کەهەریەکەتان بەگوێرەی تواناو ئارەزووی خۆی لەئاستی خۆیەوە ، لەم بوارەدا تەقەلایەك بـدات وکوێ هەڵخات بۆئەم جۆرە بەرهەمانە وتۆماری بکات ، تا لەفەوتانو وون بوون ڕزگاری بێتو کەلەپوری نەتەوایەتیمان هەنگاوی بەرەوپێشەوە بنێت .

حوزەیرانی ١٩٧٧

# پێشکەشە

* ✻ بەمامۆستا نەجمەدین مەلا
* ✻ بەمامۆستا محەمەد تۆفیق ووردی
* ✻ بەوانەی وێڵن بەدوای کەلەپوری نەتەوایەتی ڕەسەن دا . .

# باسێکی کورتی مەتەڵ

## مەتەڵ چی‌یە . . ؟!

مامۆستا ووردی لەم بارەیەوە دەڵێ :ـ

« مەتەڵ جۆرێکە لەخۆخەریک کردنو ڕابواردنی بیرو کەیی لەزمانی ئێمەش دا هەروەک هەموو زمانەکانی تر بەشێکە لەوێژەی فۆلکلۆر ، هەموو میللەتێک مەتەڵی تایبەتی خۆی هەیە ئەم مەتەڵانەش لەزمانە جیاوازەکان دا لێک چونیان لەنێوان دا هەیە . چونکە هەموویان بەهەمان دەوری قۆناغەکانی مێژوودا تێپەڕیون »

مەتەڵ پلەی ژیری دانیشتوانی دەرخستووەو کۆڕی شەوانی پایزو زستانی دیوەخانی لادێکانی کوردەواری گەرم کردووەو کاتی بێ‌ئیشیان پێ بردۆتە سەر .

مەتەڵ مانای تاقی کردنەوەو زاخاو دانەوەی مێشکە لەلایەن کەسانی ووریاو ژیرەوە دانراون . جێی سەرنجە لێرەدا چاومان پێی دەکەوێت کەمەتەڵ بەپەخشانو بەهۆنراوەش دانراونو ڕێک خراون .

ئەوەی شایانی باسە تاکو ئێستا لەنامیلکەیەکی سەربەخۆدا مەتەڵی فۆلکلۆری ، کۆنەکراوەتەوەو چاپ نەکراوە ، تەنها لەچەند کتێبێکدا نەبێت کەبەشێوەیەکی لاوەکی ئاوڕ لەم بەشەی

فۆلکلۆر دراوەتەوە . بۆنموونە مامۆستا (محەمەد کەریم شەریف) لەکتێبەکەیدا « فۆلکلۆری یاری‌یەکانی کوردەواری » ومامۆستا « محەمەد تۆفیق ووردی » لەکتێبێکیدا بەزمانی عەرەبی ( نماذج التراث الشعبي الکردي ) هەروەها نەقابەی مامۆستایانیش کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە بەناوی ( سەرنجێک لەدەروازەی فۆلکلۆری کوردی- یەوە ) کەبەهەموویان چەند مەتەڵێکی فۆلکلۆری‌یان لەئامێز کرتووە . مامۆستا ( د . عزالدین مصطفی رسول ) یش لەکتێبی ( ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی .. لێکۆڵینەوە )دا چەند لاپەڕەیەکی بۆئەم باسە تەرخان کردووەو ، بەلێکۆڵینەوەی چەند مەتەڵێـك دەرگای ئەم باسەی خستۆتە سەر پشتو دەڵێ : ـ

« مەتەڵ لەڕیزی فۆلکلۆرو بەرهەمی [ زاری ـ یا ـ دەمی ] خەڵکدا سنوور بۆدانانێکی ، کورتی ڕووداوێك یا کەرەسە یاخود مادەیەکە . بەڵام بەپێچەوانەی قسەی نەستەقەوە ، خەڵـکی ئەم سنوور بۆدانانە بەئەنقەست لەشێوەیەکی نادیار یا « تەماوی » دا دەردەخەنو ڕاستی ووتنی قسەکە ئەخەنە شێوەیـەکەوە کەخەڵکی تر بیلێنو هەڵی بێنن ، وەك ئەڵێن [ هەرئەڕۆیتو نایگەیتێ ] کە [ سێبەرە ] . لەمەتەڵدا هەروەك قسەی نەستەق شـــەقڵی تایبەتی سەرپەرشتی میللەت بەسەر ڕووداوی جیا جیـای ژیانەوە ئاشکرایە . تواناو بەهرەداری گـەل لەوەدا دیارە ، کەزۆر بـە

کورتیو پاراوی لەپاڵەوە کەرەسەو سروشتی شیعربدا بەم ڕوو - داوانە . دکتۆر عزالدین زیاتر ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ :ـ

( مەتەل لەئەدەبی کـوردیدا ، هەروەك کاڵتەو گەپ هەندێ جار بێمەبەستو بۆکات بردنە سەرو زاخاوی مێشك دانەوەیەو هەندێ جار مەبەستی تایبەتی ژیانی هەیەو هەروەك کاڵتەو گەپو بەشـەکانی تری ئەدەبی فۆلکلۆر ئەبێتە هـۆی هەوڵ دانی کۆمەڵایەتیو سیاسی . )

ئەتوانیین بڵێین ئەدەبی فۆلکلۆری کـوردی بەگشتی هەوڵو تەقەلایەکی ئەوتۆی لەگەڵا نەدراوە وتائێستا بەپوختی کۆنەکرا- وەتەوە تا ڕۆشنبیرانیش ، بەشێوەیەکی زانستی ا:ی بکۆڵنەوە .

ئەوەی شایانی باسە خەرمانی ئەدەبی فـۆلکلۆری کـوردی خەرمانێکی گەورەی دەست لێ نەدراوە پێویستی سـەرشانی هەر یەکە لەئێمە ئەوەیە ، کەبەگوێرەی تـوانا چەند مەڵۆیەك لەم خەرمانە سوور بکەینو پێش کەش بەئەدەبی گەلەکەمانی بکەین ولەفەوتان ڕزگاری بکەین ، چونکە ئەدەبی فۆلکلـۆر بنـاغەی ئەدەبەکەمانە قۆنـاغ بەقۆنـاغ . ا

هەروەها مەتەل لەئەدەبی کـوردی ئەم سەردەمەدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە لەفۆلکلۆرەوە بۆئەدەبی نووسراو کەخاوەنەکەی

دیارە ، ئەویش مەتەڵی « ژمارە » یا مەتەڵی « زانستی » یە کە لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا جار جار بڵاودەکرێتەوە . کەبۆڕاهێنان و زاخاوی مێشك وفێرکردنی منالآن و نەوەی نوێیە ، ئەونوسەرانەی لەم بوارەدا قۆڵی خزمەتیان لێ هەڵماڵیوە ، بۆمەبەستی بەرهەم هێنانی منالآنی ڕۆشنبیرە .

سلێمانی ٦/٦/٩٧٧

## بەشی یەکەم

# مەتەڵ بەشێوەی هۆنراوە . . . !

× × ×

× سواری ئەسپێ بووم ، بێ گیان بوو
دوومەڕیشم خوارد ، بێ ئێسقان بوو (١)

× بـــایی پولێکە . . . پڕبەژوورێکە (٢)

× سەربانێکەو بنبانێکە . . . چوارمەڕو شوانێکە (٣)

× بیکریت مشتێکە . . بەری‌دەیت ، دەشتێکە (٤)

× هەڵدم و بڵدم . . شەش پێو دووسم
ئەگەر نەیزانی بە لوتتا . . (٥)

× دەنوکی قەڵەم ، سەلکی مارە
ژێرسکی بەرخە ، بان پشتی کارە (٦)

---

١ - ( بێشکەو مەمکی دایك ) ٢ - ( مۆم )
٣ - ( دەست‌و پەنجە ) ٤ - ( نەفس ) ٥ - ( ترازوو )
٦ - ( حـاجی لەق لەق )

× ئەڕوا بەڕێوە پێی نییە ، هاوار ئەکا زمانی نییە
فرمێسك ئەڕێژێ ،.. چاوی نییە (١)

× ئەمە چییە . ؟ چێ پێ ئەڵێن ، پەپکە بەکونجی پێ ئەڵێن
عەبای نارنجی پێ ئەڵێن (٢) . .

× ئەگەڵێ هەیەو ئەگۆران . شیر ئەدا بە هەمزەی شوان (٣)

× ووردیلە ووردیلە ، لەبن بەردیلە
هەر کەس نەیزانی ، ناوی ئەنێم بەچکە پشیلە (٤)

× قەلای کەچین .. ڕێ نییە تێی چین (٥)

× سایەقەی سامال ، هەوری فەرەنگی
دووئاو لەجامێ ، هەریەك لە ڕەنگی (٦)

× کلاوی هەمزە پالەوان
بێ تیکەو ، بێ درووماں (٧)

× تەپ لەبان تەپ .. دەستت بەرەپ (٨)

---

١ - ( هەور ) ٢ - ( تەماتە ) ٣ - ( هەنگ )
٤ - ( یاپراخ ) ٥ - ( هێلکە ) ٦ - ( هێلکە )
٧ - ( هێلکە ) ٨ - ( دەستاڕ )

× چوومە هەردێ ، لەبن زەردێ
داری بەچەپۆك ، ئەیدا لە بەردێ (١)

× کلیلو قفڵ ، قفڵ‌دارە .. لە هەموو شارێ خەبەردارە(٢)

× مەلێك هات بەسیسی ، عیسا لەمووسای پرسی
ئەو مەلە بۆچ .. ڕۆی بەبرسی ؟ !(٣)

× خڕە وەك ( . . . ) باوکت
شەقەوەك ( . . . ) دایکت (٤)

× تالێ ئاوریشم .. بەغدا و بەسرای پێ‌ڕاکێشم (٥)

× سەری اووسە وەك هەستان
بێ‌پەڕە پەڕەی ، قورئان (٦)

× بەئەمری خودا ، بەئەقڵی‌بەنە
چنچکە لەسەر بنچکە بەنە (٧)

× یەکێ ئەڵێ ئای قلیشتم ، یەکێ ئەڵێ ئای پشتم
یەکێ ئەڵێ ئای لەووردە ، ووردەکان بان‌پشتم (٨)

---

١ - ( ئاشی ئاو ) ٢ - ( ڕەمەزان ) ٣ - (ڕەمەزان)
٤ - ( قۆزاخەی پەموو ) ٥ - ( جادەی‌قیر ) ٦ -(قارچك)
٧ - ( هەوجارو گاجوت ) ٨ - ( کۆڵەکەو داروو دەستەك )

× ئەملای کەڵەك ، ئەولای کەڵەك
لەناوەڕاستا ، چەرخ و فەلەك (١)

× ئەملای پەرژین ئەولای پەرژین
لەناوەڕاستا ، کۆترێ نەخشین (٢)

× خانوویەکم هەیە ، تەنك و تاریك
پڕێتی لە حوشتری ، مل باریك (٣)

× کەپرێکم هەیە کەپروکێ . . لێی ئەباری بەفروکێ (٤)

× زەردە وەك زەعفەران . . سپی وەك بەفری کەلان (٥)

× سەری شاخە ، ئیسمی شێرە . . قنگی ، کێرە (٦)

× هەڵەچێت و دائەچێت ، . . بەباوو باپیرتا ئەچێت (٧)

× دارەبەنێ ، لەکوێ کەنێ
شێخ و مەلا ، دەستێ دەنێ (٨)

× لەئاسمان تەبەق تەبەق . . لەزەوی کوچكو کەڵەك
مانوونەیی ، عابا بەڵەك (٩)

---

١ ـ ( زمان )　٢ ـ ( چاو )　٣ ـ ( مێرووولە )
٤ ـ ( هێلەك )　٥ ـ ( کوڵەنێرکز )　٦ ـ ( کەڵەشێر )
٧ ـ ( شەرواڵ )　٨ ـ ( لووت )　٩ ـ ( شووتی )

× هەڕاو هەڕاو ، قنگ لە قوڕاو
کەپنەك لەشان ، نوقڵە لەناو (١)

× خانوویەکم هەیە بەبێ دەرکو بـان
پڕێتی لەخانمی شان لەبان شان (٢)

+ سەرقاپی قونێ ، تامی بروێشێ
هەرکەس نەیزانێ چاوانی بێەشێ (٣)

× سەری نەبڕیت . . بۆی نەگریت (٤)

× سەری تەسکەو بنی بلاوە
کەرە کلاوە ، کەرە کلاوە (٥)

× لیفە شڕێك بەحەواوە . . بەملیۆن پینەی پیادراوە (٦)

× بەسەر پیرێژن ، بەچنگ منـاڵە
بەپشتی ڕۆستەم ، نەتەوەی زاڵە (٧)

× خاڵوێەکم هەیە هوونی هوونی
دەست لەباخەڵ سەر لەقوونی (٨)

---

١ـ « چەلتوك » ٢ـ « هەنار » ٣ـ « دووگی مەڕ » ٤ـ «پیاز»
٥ـ « کلاو » ٦ـ « ئەستێرەو ئاسمان » ٧ـ « سیخوڕ »
٨ـ « ژیشك » .

× ئەم لای دارو ئەولای دار
تیایەتی دوو سەگی هار (١)

× قەڵای گۆشتین . . پێ پلیکەی ئاسنین (٢)

+ ئەمە چی یە کیژە کیژێتی
عالەم بەتەمای خوشەی میژێتی (٣)

× ڕەپ ڕەپ وەستاوە . . . پەڕۆی تیا گیر ماوە (٤)

× سەوزە وەك خەیار ، . بەرزە وەك چنار
مزرە وەك هەنار . (٥)

+ سەری بەردە بەرد نی یە ، ژێری بەردە بەرد نی یە
گیا خۆرە کەرنی یە ، هێلکە کەرە مر نی یە (٦)

× سکی بەرخە ، پشتی کارە
کلکی مقەست ، سەری مارە (٧)

+ ڕەشە وەك بزن . . ووردە وەك هەرزن
بەپێنج بۆی دەچن . . بەدوان دەی دزن (٨)

× بەباڵ مەلو بەشاخ گایە . . ماسی پشتەو هەرە پایە (٩)

---

١ـ « جەنجەڕ » ٢ـ « ئاوزنگی ماین » ٣ـ « چای سەماوەر »
٤ـ « کەنوو » ٥ـ «ڕێواس» ٦ـ « کیسەڵ » ٧ـ « پەڕەسێلکە»
٨ـ « کێچ » ٩ـ « کوللە »

+ خڕە وەك گۆ . سپی وەك دۆ (١)

+ هەرلێرە هەتا مەکە .. هەمووی شەکی چاوبەڵەکە
کشتی بەقسری کوان ئەکا (٢)

+ مەلێکمان هەیە مەلە خاتۆرە
قاچو قول باریك سەربالی بۆرە (٣)

+ چوار پێ لەزەوی ، دووپێ لە ئەنیشت . .
( . . . ) لەناوگەل ( . . . ) لەسەرپشت (٤)

+ هێلکەی ماتێ . ، با نایگاتێ (٥)

+ بەسندوقی هەشتەرخان . . تیایەتی لەپیرو جوان (٦)

+ لەسەك بەبۆن تر . . لەتوولە ڕەشتر (٧)

+ چالێکی چل گەزی . . فاتمەخانی تیبەزی
سەری پڕە لەدەرزی . (٨)

+ داری بێ گول . . ئەسحابەی بێ دل
خواردنی بێ توێکل (٩)

---

١ـ ( هێلکە ) ٢ـ ( کچ ) ٣ـ ( کوللە ) ٤ـ ( بووکێك سواری ئەسپ بووبێ ) ٥ـ ( گوللە ) ٦ـ ( قەبر ) ٧ـ ( قالۆنچە ) ٨ـ ( کنگر ) ٩ـ ( هەنجیر ـ ماسی ـ خوێ ) .

+ ئەخزێ و ناخزێ .. هەڵمەت دەبا بۆ کوزێ
دانی نی‌یە ، بیکەزێ (١)

+ چواربرا هەن لەچۆمێ .. تیر ئەهاونەکومێ (٢)

+ چواری چاوە ، هەشتی هەنگاوە .. بۆ درەی ناوە (٣)

+ چواری ئەچەقێ ، دوانی ئەرەپێ
دوانی ئەلەقێ .. دوانی ئەزەقێ (٤)

+ تەڕی ئەکەیتو بەلی ئەکەیت .. بەخۆتیا ئەکەیت (٥)

+ مل باریکە .. قۆل باریکە ، من ناوێرم .. تۆئەنێرم(٦)

+ بەڕەق وەك دارە .. لووتی زور خوارە (٧)

+ گەرمیشەو نەرمیشە .. بەنەخوێنەکەی بکەوە تێی‌نیشە(٨)

+ هەرلێرە هەتا دەرگەزێن .. هەمووی سۆفی سەرلەرزێن(٩)

+ سێ‌بەی .. سێ‌زەردبەی .. سێ‌هەنار .. سێ‌زەهری‌مار (١٠)

+ لەتەناڵێ .. خستمە چاڵێ .. هەتاساڵێ (١١)

---

١ - ( مەشکە ) ٢ - ( کوانی‌مانگا ) ٣ - (جووت کردن)
٤ - ( بزن ) ٥ - کەوچك ٦ - ( تفەنگ ) ٧ - ( نۆك )
٨ - ( گیپە ) ٩ - ( شەکرۆکە ) ١٠ - (چواروەرزی ساڵ)
١١ - ( جوانوو )

+ سوارێك هات بەهۆهۆ ، . ئەسەری هەبوو ئەڕاپۆ (١)

× چاڵێ قەوی . . دوو کونە ڕێوی
دوو چرای گەش . . دوو ماری ڕەش (٢)

× کە نام پێتەوە . . لێت نابێتەوە (٣)

× مەرە ڕەشی موکری . .
ئە مووی هەیە ئەخوری (٤)

× وەستای زەنوور . .
دەورەکەی بەفرو ناوەکەی تەنوور (٥)

× پشتی لەخواروو دەستی لەحەوا
بزن هەی بزن ، بـاری تەعالا (٦)

× زەردە خۆ زەردە خەنە
سەد قتوو لەسەر یەك قتوو بەنە (٧)

+ سەمەن قتوو سەد قتوو
هەر قتووی لەیەك قووتوو (٨)

---

١ـ « هەور » ٢ـ « دەمو اووتو چاو برۆ » ٣ـ « نـاو »
٤ـ « کێچ » ٥ـ « سەماوەر » ٦ـ « مەشکە » ٧ـ گەنمەشامی»
٨ـ « پیـاز »

× سندوقی زەردی یەمەنی
تەقلە مەکە ئەیشکێنی
تەقلە مەکە کلیل دارە
لە هەموو شارێ خەبەردارە (١)

× سێ سەدو شەستو شەش هێلکانە
دوانزە بەچکەو ، یەك دایکانە (٢)

× سەری یەکەو بنی دووە
بەباوکو باپیرتا چووە (٣)

+ دەنگی هەیەو ڕەنگی نی‌یە
بەمەقاش بیگری گۆشتی نی‌یە (٤)

× ڕەقی ڕەقایی ، دام لەنەرمایی
گەیشتمە گەرمایی (٥)

× تولی تەڕ . توول بەندی تەڕ
نالەی گەوهەر ، شمشالی گەڕ (٦)

× مریشکێکم هەیە زەنگی زەنگی
هێلکە ئەکا پڕ بەچنگی (٧)

---

١ـ « ڕەمەزان » ٢ـ « سالو مانگو ڕۆژ » ٣ـ « شەروال »
٤ـ « ڕەشەبا » ٥ـ « ئەستێو بەرد » ٦ـ « هەورە بروسکە »
٧ـ کەرەی ناو مەشکە .

× بنی بی‌یە ، سەری شاخە
ناوی ئاسنی پڕ لە زاخە (١)

× کەوەڵاو کەوەڵ ، ناوێکیان هەیە
شەش پاو دوو سەرو چاوێکیان هەیە (٢)

× ئەفڕێ باڵی نی‌یە . . . سەری ئەبڕی خوێنی نی‌یە (٣)

× لەسکی دایکی دێتە دەرێ . . پشتی باوکی ئەخورێنێ(٤)

× عەبایەکم هەیە لە دەشتی
حەو سەد کونی لە پشتی (٥)

× ئەمامێکم هەیە ، لەبن گڵی
بەکونان دەڵێ ووڵی ووڵی (٦)

+ شتێك هەیە بزورکی
سەری زلی لەوورکی (٧)

+ ووردە وەك هەرزن ، بەرزە وەك حوشتر
شیرین وەك شەکر (٨)

---

١ـ ( خەنجەر ) ٢ـ ( مەلا کوێرەیەك سواری ئەسپێکی یەك چاو بووبێت ) ٣ـ ( پەلکە کەلا ) ٤ـ ( دەنکە شقارتە )
٥ـ ( ڕەشکە ) ٦ـ ( مشکە کوێرە ) ٧ـ ( مێرووولە )
٨ـ ( دارتوو )

× ئەگەر ئەقڵ داری ئەقڵت تەواوە
چی گۆشتی لەدەرە ، پێستی لەناوە (١)

× ئەگەر ئەقڵ داری ئەقڵت بەگیرە
لەناو مەلاندا کامیان بەشیرە (٢)

× بەرهەسانی پشت خوری . . .
گەرنەیزانی لەبەری مری (٣)

× ئەکرمێنێ وەك هەور . . .
فرێی ئەدا سلی چەور (٤)

× کارەشی وەسمان . . .
دەنگی ئەکاتە ئاسمان (٥)

× ئەملام تات و ئەولام‌تـات . . .
وەی دایە جیقم دەرهات (٦)

× چەوت و چێڵ و چەمی‌یە . .
ووشك و ڕەق و بێ‌دی‌یە (٧)

× وەیا چەوت‌وچێڵ و چەمەندە . .
لاشەی بێ‌ئێسقان سەری بێ‌دیدە (٨)

---

١ ـ ( سیقەتۆرە ) ٢ ـ ( شەمشەمە کوێرە )
٣ ـ ( کلاشی پەڕۆ ) ٤ ـ ( مەشکە ) ٥ ـ ( تفەنك )
٦ ـ ( ئەسپێ ) ٧ ـ ( گۆچان ) ٨ ـ ( گۆچان )

× چل ناڵەو چل بزمارە . .
چل چلۆکەی چل هەزارە (١)

× حەوایلکەی حەوا ئەکا . .
بەهەرچوار پەل سەما ئەکا
خواردنی کوڕی پاشا ئەکا (٢)

+ ئەناڵەو ئەبزمارە . .
پێنچ پێنچوکەی چل هەزارە (٣)

× مەلێ هاتووە بەهۆهۆ . . ئەتانی هەیە ئە پۆ (٤)

× خەرکەوە خەربەن کەوە
بەستمە بنچك ، بنچکیش کەوە (٥)

× ژوورێکی پاکو سپی
خانمی جوانی تیا ئەژی (٦)

× خاڵۆیەکم هەیە یارۆ یارۆ
دەرقنك ڕەشی ناوچەوان مارۆ (٧)

× خاڵۆیەکم هاتووە لەئەوێڵیەوە
کێرو گونی هایە کۆڵیەوە (٨)

---

١- ( کرمەك ) ٢- ( هەنگ ) ٣- ( پلاوپاڵێو ) ٤- ( لباد )
٥- ( شووتی ) ٦- ( دەمو زمان ) ٧- ( زەردەواڵە )
٨- ( چیغ چنین )

× هەڵ ئەپەڕێ پای نی‌یە . . . دائەنیشێ قنگی نی‌یە
سەری سپی مووی نی‌یە (١)

× زەردی زەعفەران . . . نـام لە ئێستران
بردم بۆ شاری کافران (٢)

× کونە گردەڵەی ، ئۆمەن باریەتی
ڕۆح دار نی‌یەو ، ڕۆح دار سواریەتی (٣)

× چوار باڵو سەرێ ، دایم بەدەوە
جڕو جەواشێر ، مەکانی ئاوە
زەردەی خۆرئاوا ، لێش بەئەنێشە
هێستریَ مزگێنی بزانی چێشە (٤)

× سەگێ هـار لەبان دار
کلوو کلوو بەفر ئەخاتە خوار (٥)

× لەدار ئەکرێ ، لەبەرد ئەکرێ
وەکو ئەسپ زین ئەکرێ (٦)

× خواردنی میرە ، میر بۆی زەروورە
چواردەوری بەحرە ، ناوی تەنوورە (٧)

---

١- ( تەرزە ) ٢- ( تووتن ) ٣- ( نـاڵ ) ٤- ( ماسی )
٥- ( مەکینەی سەرتاشین ) ٦- ( پرد ) ٧- ( سەماوەر )

\+ مامێکم هەیە لە دەشق . .

کەچە شیرێکی لە پشق (١)

\+ هەرلێرە ، هەتا قلیاسان . .

هەموو خرێنکە خرێنکەی داسان (٢)

\+ بەکزادەی هەڵەدنێ . .

جووتێ خاڵی لە گەردنێ (٣)

\+ بزنە قووتەی مەلایە . .

نەی هێشتووە بنچکە گیایە (٤)

\+ لە دووردێ ، لە نووردێ . .

قەڵەمو کاغەزی سووردێ (٥)

\+ قۆزەڵەیەکم هەیە قرمزی . .

کونی نەبوو ناوی دزی (٦)

\+ خۆی هەندۆکە ، بەندۆکە . .

لەپێش پاشا ئەڵێی بووکە (٧)

\+ شین وەشینی ، زەرد وەك زێڕی

سپی وەك پەنیری (٨) . .

---

١ - ( دووپشك ) ٢ - ( تەرزە ) ٣ - ( باگردین )
٤ - ( چەقۆ ) ٥ - ( هەورە بروسکە ) ٦ - (شووتی)
٧ - ( چرا ) ٨ - ( نێرگز )

× بنوێ کسایە . . .

هەڵسێ چیایە (١)

× دووبەندو ، بەندێکە . .

دوودەف و دارێکە (٢)

× نەبایە نەبارانە . .

چك‌چکە لە دارانە (٣)

× بەعیساکەم بەمووساکەم . .

هەردوو لنکی لەحەواکەم

زێڕو هوڕی ، پێ‌پەیدا کەم . . (٤)

× ئەمەندۆکە ، پڕپنۆکە . .

لەپێش پاشا ئەڵێی بووکە (٥)

× هڕم کردەمەڕەکی . .

سەدمەڕهات لەڕەنگەکی (٦)

× هەر لەزەمانی ئەسحابی . .

کوڕ گەورەتربوو لەبابی (٧)

---

١ - ( ڕەشماڵ ) . . ٢ - ( تەرازوو ) ٣ - ( کوندەڵان )

٤ - ( شەغرە لەکاتی بـــارکردنا ) ٥ - ( برنـــج )

٦ - ( شانەزەردەواڵە ) ٧ - ( گوێ درێژی بابی هێستر )

× نۆمانگ لە زەوی سێمانگ بەدەرە
هەوەڵ بۆ ئادەم، دووەمین بۆکەرە (١)

× چوار مامە فەقێ ، هەشتی حەتەڵحووتی
حەتەڵحووتی ڕەو کوێنی ، مامەفەقێ شەو کوێنی (٢)

× نۆ نۆردووی نۆنان . . نۆنان
هەرکوفتەی ، نۆپشیلە لەسەر

هەرنانی نۆکوفتە لەسەر . .
هەرپشیلەی نۆفەرخەلەبەر (٣)

---

١ ـ ( کەنگر )  ٢ ـ ( جووت کردن )
٣ـ[ (٥٩٠٤٩) فەرخەپشیلە ]

# مەتەڵ بەشێوەی پەخشان

× لەبەیانی‌یەوە تاکو ئێوارێ خۆڵ ئەکا بەسەرخۆیا ، ئێوارەش وەك بووك ئەچێتە ژوور ماڵ . ؟! (١)

× کردێك هەیە ، حەوت کانی پێوەیە ، دوانی تاڵە ، دوانی سوێرە ، دوانی ترشە ، یەکێکیان شیرینە ! (٢)

+ ژنی سك پڕ ، سێبەری نی‌یە (٣)

× هەموو شتێکی پیا ئەچێت (٤)

× بەسەد برا ریخۆڵەیەکیان هەیە (٥)

× سەربال بازو بن بال سوێسکە ، ئەرنەمووك ئەولاە چ پێغەمبەرێکە . ؟ (٦)

× خڕ درێژە [ مەبەست خڕی خاسەیە ]

× سەر لووسی بن پەراسوو (٧)

---

١- ( کاسن ) ٢- ( سەر . گوێ . لووت . چاو . دەم )

٣- ( مانگ ) ٤- ( گوێ ) ٥- ( تەزبیح ) ٦- ( مۆزە) جۆرە مێشێکە ٧- ( سەربانو بن بان ) .

+ هەرنەڕواو لێی بەرنەبێ ( شوێن پێ )

+ لەپڕنیوە . . لەنیوەپڕە ( مانگ )

+ سەری لە ئەرزە ، قاچی لە ئاسمان . . ( تەرەپیاز )

+ لوولەی گۆشتین ، دیوار ئەبڕێ . . . ( مشك )

+ ئەیبینی ، لەبەری ناکەی . . لەبەری کەی نایبینی ( ١ )

+ ئەمەچی‌یە . ؟ ! لەدوورەوە دەمی بۆنەکەیتەوە ؟ ! (٢)

+ ئەڕوا بۆدەشت ڕوو لەماڵە . . ئەڕوا بۆماڵ ڕوولەدەشتە (٣)

+ سێ پایلکەی ، سەرڕەش کەرەی کێمت کیف کەرە (٤)

+ شلی کولی بێمووە ( بۆق )

+ مامەیەکم هەیە ، لەقونەوە ڕیش دەرئەکا ( ڕەگی پیاز )

+ بەچەرەشی بزن جینگانە . . ( برێشکەی ناوساج )

× تیکەی قنك ئەخوا . . ( هێلکە )

× گوی دەڵە قنج ئەخوا ( هەنگوین )

× هەر ئەڕۆیتو نایکەیتێ ( سێبەر )

× پەنجە ئەکەی بەقونیا ، دەم دائەپچڕێ ( مقەست )

× یەکێکی لێ ئەکەم ، دوانی پیابەر ئەدەمەوە ، بەووشکی تێی ئەخەم . . بەتەڕی دەری ئەهێنمەوە ( ٥ )

---

١ - ( کفن ) ٢ - ( خواردن ) ٣ - ( شاخی بزن )
٤ - ( پەرەمێز ) ٥- ( زین و ناوزینگو لغاوی ئەسپ )

× بەپەل بی ، بەکەلاتوو ، بەبەرهەرمێ ( پەموو )

× ئەسپی تۆپیوو ، جۆئەخوا . . ( ئاش )

× بەسێ برا کڵاوێکیان هەیە . . [ سێ پا ]

× چوارپێ لە حەوا پشتی لە ئەرزی . . لێی ئەدەی فلتانی فلـــق [ مەشکە ]

× دەمت بەقنگی ، دەستت بەکێری . . خۆشی خۆشـــی هەڵدەستێت ئاگری بۆ دێنێ . . [ سەبیل ]

× بەدوو ژوور کۆڵە کەیەکیان هەیە [ لووت ]

+ تێ کردنی سوونەتە ، لەقاندنی فەرزە [ ئەمووستیلە ]

+ کاچوو مادانی . . [ شەن کردن ]

+ سەری بەخۆت ، بنی بەدایکت . [ مەمك ]

+ هەتا لێی نەدەیت زل نابێت . . ( کونك )

× سواڵەتە شکاوێ بەلادیوارەوە . . ( کوێ )

+ وەزن سووکو قیمەت کران . . ( ئاڵتون )

× ئەمە چییە . ؟ شەو لەبانە . ! ( باکردێن )

× مارێك لەناو حەوزێکایە ، کوڵێکی بەدەمەوەیە ، مارەکە ئاوەکە ئەخوا ، کوڵەکەش مارەکە ئەخوا . .

( لەمپا . . چرا )

+ قازیلەی یەك چاو . .               ( سوژن )

× قنکی بەدەمت ، تسی بەلووتت . . ( جگەرە )

× نەشیرە نەشەکرە ، بەبێ هەوێن دەمەێت . . ( سەهۆڵ )

× دیزەی ڕۆنەو دەرخۆنەی قوونە ، ئەگەر نایخۆی بۆ منی
بێنە . . ( دووگی مەڕ )

+ هەتا نەیبەستی ناڕوا . . ( کالە )

+ زەوی سپی‌و تۆوی ڕەش . . ( کاغەزو نووسین )

+ تا لێی نەدەیت دەنگی نایە . . ( دەهۆڵ )

+ سەوزە لەبازاڕ . . سوورە بەدایکت . . ( خەنە )

+ هەتا سەرەو نخوونی نەکەیتەوە پڕ نابێت . . ( کڵاو )

+ ساجی زنجیر ، کەوتە مەنجەڵ ، گۆڵەکە نەوی .
بەغدا ڕەوی . . ( هەورە بروسکەو باران )

+ تا لێی نەدەی ناڕی ، . . ( هێلەك )

— هەتا بیبڕی ، درێژ ئەبێ . . ( جۆگە )

— دەچێتە جووتی ( یەکە ) کە دێتەوە ( سێنە )
« سێنە » ژمارە نی‌یە بەڵکو ناوی مرۆڤە

— هەموو توخمەکەی ببڕیتەوە ، ساڵێ تر سەوز ئەبێتەوە

« هێستر » کەتوخمی نی یە

— هەرجێیە گای سووری لێ بنوێ ، گیای لێ سەوز نابێ

« ئاگر »

— لەم تاشێ بیکەرە ئەو تاشێ . . « باراش »

— ئەشکەوتی سەد پاڵەوان ، بەقامکە پوشێ دەگیرێ

( شارە مێرووله )

— قەسری سپی ، دەمانچە لەسەر

( ڕانە مریشك لەسەر برنج )

— سەد سوار لەبەر سوارێ ، دەلەرزێ . .

( تەون کردن )

— سێ سوار هاتنە شارێ . . هەرسێیان چوونە ماڵێ

( ڕەمەزان )

ئەو سەرچاوانەی بۆئەم نامیلکەیە سوودی لێوەرگیراوە

١ — نماذج من التراث الشعبي الكردی / محمد تۆفیق ووردی
چاپی نجف ١٩٧٥

٢ — ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی . . لێکۆڵینەوە / چاپی بەغـدا
(١٩٧٠) دکتور عزالدین مصطفی رسول

٣ — سەرنجێك لەدەروازەی فۆلکلۆری کـوردەوە / بەرهەمی
نەقابەی مامۆستایان .

٤ - فۆلکلۆری یاری‌یەکانی کوردەواری / محمد کریم شریف
چاپی یەکەم - کەرکوك ١٩٧١

٥ — گۆڤاری پەروەردەو زانست ژمارە یەك سالی یەك

٦ — گۆڤاری بەیان ژمارە (١٣) سالی ١٩٧٤

**سەرنج :** - تکایە لەلاپەرە (٦) دێری (٥) [ سەرنجێ
لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردی‌یەوە ] بکرێ بە
( سەرنجێك لەدەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە ) .
وە لە لاپەرە (١٦) دێری (٥) ( ئەرەپێ ) بکرێ بە ( ئەرەقێ )

# سوپاس

بۆ کاك هوشیار سیوەیلیو کاك سیروان عەبدوڵلاو کاك توانا جەلالو کاك هیواو کاك ناصحو کاك سالار فەتاحو کاك کامل فەرەجو کاك طاهیر ڕەشید و کرێکارانی چاپخانەی ڕاپەڕین کەهەریەکەیان لەئاستی خۆیەوە ، دڵسۆزانە یارمەتییان داوم . . وە زۆر سوپاسی کاك عەبدوڵلا کەریمو کاك فەرەیدون عەبدول بەرزنجی ئەکەم ، کەئەرکی چاپ کردنی ئەم نامیلکەیەیان خستە ئەستۆی خۆیان .

سەردار فەتاح ئەمین

# ـەرمانێک
# لە
# ـەتەکی فۆلکلۆری
# کوردی




١٩٧٧

سلێمانی

**کڵیشەی بەرگی ئەم نامیلکەیە ..!**

بەرهەمی دەستو خامەی ڕەنگینی هونەرمەندی مەزن مامۆستا [ محەمەد عارف ] ، لە گۆڤاری ( بەیان ) ، وە وەرگیراوە

**نرخی ( ١٥٠ ) فلسە**


رقم الايداع فى المكتبة الوطنية ببغداد ( ١١٧٦ ) لسنة ١٩٧٧

٢٠٠٠ - ٦/١١/ ١٩٧٧

چاپخانەی ڕاپەڕین سلێمانی شەقامی کاوە تەلەفون ٢٢٦٥٦